زنجیرەی پەروەردەیی

(٤)

# دامەزراوی

## (الاستقامة)

ئامادەکردنی/ حەمزە بەرزنجی

لەڕێی خوای گەورەدا دەبەخشرێت و نافرۆشرێت

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:

(احب الاعمال الى الله تعالى ادومها وإن قل)

متفق عليه

واتــــە: خۆشەویســـترین کـــردەوە بــــەلای خـوای گـەورەوە ئەوەیـە کـە بـەردەوام بیـت لەسەری گەرچی کەمیش بێت.

بِسمِ اللهِ الرَحمنِ الرَحيمْ

# الحَمدُ لله وَالصلاةُ والسلامُ على رَسولِ الله

# وَعلى الهِ وَصحبهِ وَمَن والاه

## دامەزراوی

دامەزراوی واتە چەسپان و بەردە وام بوون لەسەر ڕێبازی ئیسلام و کۆڵنەدان و پاشەکشەنەکردن وپێشوو درێژی و ساردنەبوونەوە وخۆگری. کەئەمیش ڕەنگدانەوەی ئیمانی ڕاست و دروستە. بەبێ بوونی ئەم خاڵە مرۆڤ دووچاری سەرگەردانی گەورە و گومڕابوون دەبێت. کە ئەو کات سزای زۆر سەخت تر دەبێت لای خوای گەورە لە کەسێکی نەفامی نەشارەزا. خوای گەورە دە فەرموێت:﴿إنَ ألذينَ امنوا ثُم كَفروا ثُمَ امنوا ثُمَ كَفروا ثم ازدادوا كفراً لَمْ يَكُنْ الله ليغفِر لَهمْ ولا ليهديهم سَبيلا ﴾. النساء/١٣٧.

واتــە: ئــەوانی  ئیمانیــان هێنــاو پاشــان بــیٚ بــڕوا بوونەوەو بەردەوام  و دامەزراو نەبوون پاشان ئیمانیان هێنایەوە و دواتر یش کافربوونەوە. ئینجا بیٚ باوەڕیان زیـاد کـرد ئـەوا خـوای گـەورە لیٚ یـان خـۆش نابێـت و ڕێنمونیان ناکات بۆ ڕێگای ڕاست.

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: هەرکەسێك وابزانێــت هــەموو کافربوونێــك دوای ئیمــان هێنــانیٚ تەوبەی لیٚ وەردەگیرێت ئەوە بیٚ گومان پێچەوانەی دەقی قورئانی کردووە/ الصارم المسلول ص ٣٦٨.

جــا موســڵمان پێویســتە لــە هــەموو بوارەکــانی دا دامــەزراوبێت دامــەزراوبێت لــەبیروباوەڕو عەقیــدەداو شــوێن ڕێبــازی مرۆڤکردەکـان نەکـەوێت و ئیسـلامەتی خۆی هەڵنەوە شێنێتەوە.چونکە سنگی مـرۆڤ  یـەك دڵـی تێدایە .پێویستە یەکلای  بکاتەوە  یان بۆ خوای گەورە و ڕێبازەکەی یان بۆشـەیطـان و هـەواو ئارە زوو بەرنامـە دەســتکردەکان. وە دامــەزراو بێــت لــە عیبــادەت و پەرستشــداو خــۆی  نەچــوێنێت بــەگاو رو جولەکــەو

بیدعەچیەکان . وە دامـەزراوبێت لەخوڕەوشـت و ئاکـارو ڕە فتاری دا و خۆی وەك کەسانی بێ ڕەوشتی ڕۆژئاواو چـاولێکەرانیان نـەکات کـە لـە ولأتـانی موسـڵمانانـدا خەریکـە تـوۆوی بـێ ڕەوشـتی و بچـڕاندنی شـیرازەی کۆمەڵگا دەچێنن.

پێچـەوانەی دامـەزراوی بریتـی یـە لـە خۆنـەگری و نەوەسـتان لەسـەر بارێـك کـە ئەمـە لـە سیفەتی دەغـەڵ و مونافیقانە. خوای گەورە دەفـەرموێت:﴿ وَمِـنَ النـاسِ مَـن یَعبدُاللهَ علی حرف فإِن أصابَهُ خیرٌ اطمَأنَ بـهِ وَان أصـابته ُفتنـةُ انقَلَبَ علی وَجههِ خَسـرَ الـدًنیا وَالاخـرة ذلِـك هـوَ الخسـران المُبین﴾.الحج/١١.

واتـە: لـەناو خەڵکیـدا کەسـانی وا هـەن خواپەرسـتی دەکەن بە شێوەیەك کـە لـە کـەنارێکی ئیسلامەتیدا بـن و مۆلەقانـە مامەڵـە دەکـەن. کـاتێ توشیخۆشـی و خێرێـك بـوون (منـداڵی بـوو یـان وولأخەکـەی زا) دڵخـۆش و دڵئارام دەبێت و (دەڵێت ئەمـە دینی چاکە). خۆ ئەگـەر تووشی تاقی کردنـەوە و ناخۆشـی یـەك بوو لەسـەر ڕوو

هەڵدەگەڕێتـەوە و دەگەڕێتـەوە بـۆ نـەفامی و دەڵـێ ئەمـە دینێکی خراپە. بەم هەڵوێستەی دنیاو قیامـەتی دۆڕانـد کەبەڕاستی ئەمە دۆڕانێکی ئاشکرایە.

کەلـەم زەمانەشـدا کەسـێك ئیمـان دەهـێنێ و لەسـەر ئیمانەکەی تووشـی ناڕەحـەتی یـەك دەبێـت یـان ئازاری دەرونـــی یـــان جەســـتەیی دەچـــێژێت خێـــرا پاشـــگەز دەبێتـەوەو چـۆکی دەشـکێ. کـە ئـەم کەسـانە بـەر ئـەم هەرەشــە گەورەیــە دە کــەون . عبــدالله کــوڕی مەســعود نمونەیـەکی جـوان دەهێنێتـەوەو دەفـەرموێت: (نمونـەی ئیمانـدار و کەسـی مونـافیق و کـافر وەك سـێ کـەس وان کــە خۆیــان بگەیەننــە دۆڵێــك (لەڕیوایــەتێکی تــردا : ڕوبارێـك). یـەکێکیان خـۆی تـێ بخـات و بپەڕێتـەوە و بیبڕێت. پاشان کەسی دووەم خـۆی تـێ بخـات تـا دەگاتـە نیوەی دۆڵەکەو کەسی سێهەمیش لـە قـەراغی دۆڵەکـەوە بـانگی بکـات و بڵێـت: مـاڵ وێـران بـۆ کـوێ دەچـیت. نـەڕۆیت ئـەگینا تیادەچیت بگـەڕێوە. وە ئـەو کەسـەش کەپەڕیوەتـە ئەوبـەرەوە بـانگی لـێ بکـات: وەرە بـەرەو

ڕزگــاربوون و بپــەڕێرەوە. ئــەویش جارێــك تەماشــای ئەویان وجارێك تەماشای ئەمیان بكات. تا لەپڕ لافاوێك بێت و نوقمی بكات . جا ئەو كەسەی پەڕیوەتە ئەوبەرە وە ئیماندارەكەیە. ئەو كەسەش كە نوقم بوو وە تیاچوو دەغـەڵ و مونافیقەكەیـە كـە خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ مُذَبــذَبينَ بَــينَ ذلــكَ لا الى هــؤلاء وَلا الى هــؤلاء﴾ ئـەو كەســەش لەمبــەرەوە ماوەتــەوە نمونــەی كافرەكەیــە. جاپیاوی مونافیق بەردەوام لەگومان و دوودڵی دایە تا مـردن دەیگـاتیٚ). أخرجة ابن أبي حاتم كما في تفسير ابن كثير ١٨٤/٢ ورواه ابن جرير عن قتادة مرسلا . كما في (منتخب كنز العمال) ٩٤/١.

جـا لــە ڕاســتی دا ئــەمڕۆ كەســانی زۆر هــەن لــە بێبـاوەڕان كـە نایانـەوێت خـەڵكی ڕزگاریـان ببێـت و لـــەگومڕایی بپەڕنـــەوە بـــەرەو نـــوری هیدایـــەت و بەڕاگەیاندنی بیستراو و بینراو و خوێنراو ماڵ و سامان ســـەرف كـــردن و ئـــازارو زینـــدانی كردنـــی تـــازە موسڵمانان دەترسێنن.

دەسا برای شیرین و خوشکی سەنگینم نەکەیت لەو کەسانە بیت دوو دڵ و خوێن سارد جۆش دامێنیت و بترسی و مردن لەسەر ئەو حاڵەتەپێت بگات و دونیاو قیامەتت لەکیس بچێت. چونکە ئەو کەسانەی خۆڕاگر نین لەسەر ئیسلامەتی و موسڵمانێتی و زوو واز ئەهێنن لەو کەسانەن کە لەڕۆژی دوایی دا لەحەوزی کەوسەر دوور دەخرێنەوە پێغەمبەری خوا ρ دەفەرموێت: (لە ڕۆژی دوای دا کاتیٚ لەسەر حەوزی کەوسەرم کۆمەڵێك لە هاوەڵانم دێن تا ئاوبخۆنەوە (لەڕیوایەتێکی تردا: لەوانەی هاوریٚ یەتیان کردوم) تاکاتیٚ نزیك دەخرێنەوە بەخێرایی دووریان دەخەنەوەو ڕاپێچیان دەکەن (لەڕیوایەتێکدا: کۆمەڵێك پیاوو ئافرەت دوور دەخرێنەوە لەحەوزی کەوسەرو ناهێڵن هیچی لیٚ بخۆنەوە) منیش تکا دەکەم لەخوای گەورەو دەڵێم: پەروەردگارە گەلەکەم. پەروەردگارە نەتەوەکەم. (لەڕیوایەتێکدا: پەروەردگارە ئەوانە لە هاوەڵانی من بوون) لە ئوممەتی من بوون. دواتر دەوتریٚ: ئەی محمد

تـــــۆ نازانیـــــت ئەمانـــــە چـــــییان داهێنـــــاوە دوای تـۆ.(لەڕیوایـەتێکی تـردا: ئەمانـە دوای ئـەوەی تـۆ جیـا بویتــەوە لــێ یــان پشــتاو پشــت هەڵگەڕانــەوە. منــیش دەڵـێم: **(سحقاً سحقاً لِمَن غيّر بَعدي)** . واتە:بـە هـیلاك بچـن و تیاچن ئەوانەی دوای من دینیان دەگـۆڕن . رَواه البَخاري (٦٥٨٤) في مَواضع. وغيره.

وە یـــەکێك لـــە مەرجـــەکانی وتنـــی (لا الـــه لا الله)و موسـڵمانێتی بریتیـیـە لـە مـردن لەسـەر ئـەو حاڵەتـە. چونکە عاقیبـەت خێـری مـەرجی موسـڵمانێتی و چـوونە بـە هەشـتە. ئـەوەتا پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفـە رموێـت: (سوێند بێ بەو خوایەی نەفسـی مـنی بـە دەسـتە کەسـی واتان هەیە بە کارو کردەوەی ئەهلی بەهەشت کاردەکات تـا ئەوەنـدە نزیـك دەبێتــەوە لــە بەهەشــت نێـوان ئــەوو بەهەشت باڵێکی دەمێنێت. ئەو کات نامەی کردەوەکانی پێشـی دەکـەوێت و بـەکارو کـردەوەی ئـەهلی دۆزەخ کـار دەکات و دەچێتە دۆزەخـەوە. وەکەسـی واشـتان تیدایـە کــە بــەکارو کــردەوەی ئــەهلی دۆزەخ کــار دەکــات هــەتا نێـوان ئــەوو دۆزەخ بــاڵێکی دەمێنێت.ئـەو کاتــە نامــەی

کردەوەکانی پێشی دەکەوێت و کار بەکردە وەی ئەهلی بەهەشت دەکات و دەچێتە بەهەشتەوە). مُتّفقٌ علیە. صحِیح سُنَن ابن ماجە(٦١).

هەر لەبەر ئەمەش بوو پیاوچاکان زۆر دەترسان لەعاقیبەت خراپی و وەرگەڕان لەدین پێش مردن. دەگێڕنەوە کاتێ ئیمامی ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە سەرەمەرگدا بوو لە هۆش خۆی چوو دەیووت: (**لا بَعد .لا بَعدُ**) واتە: نا هێشتا نا. کاتێ هۆشی هاتەوە **عبدُالله** ی کوڕی لێ ی پرسی: بابە گیان ئەو ووشەیە چی بوو لەو کاتەدا دەتوت؟ فەرموی: کوڕی خۆم.لەو کاتەدا ئیبلیس لە سوچێکی ژوورەکەدا وەستابوو گازی لەپەنجەی خۆی دەگرت و دەیووت: ئای ئەحمەد لەدەستم دەرچوی (نەمتوانی گومڕات بکەم) .منیش ئەمووت: نا هێشتا لە دەستت دەرنەچووم و ئەمین نیم لێت تا لەسەر ئەم ئیسلامەتیە ڕۆحم لەلاشەم دەرنەچێ./ مُقَدِمَة مُسنَد الامام أحمَد ١/١٤. طبعةمَکتَبَ الاسلامي.

# سەرئەنجامی دامەزراوی

یەکێك لەدەرئەنجامەکانی دامەزراوی ئەوەیە کە لەکاتی سەرەمەرگدا . لەو کاتە زۆر ناسکەدا کەمرۆڤ زۆر لاوازو غەریب و بێ نازە. فریشتەکان دڵنەوایی دەکەن و مژدەی خوشی دەدەنێ و دەڵێن ترس و غەمت نەبێت ئێمە دۆست و هاوەڵتین. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿انَ الذينَ قالوا رَبُنَا الله ثُمَ استَقاموا تتنزل عليهمُ المَلائِكة ألا تَخافوا وَلا تَحزَنوا َوأبشروا بِالجنة الذي كُنتُم تَوعَدَون نَحنُ أَولياؤكم في الحَياة ِالدنيا وَفي الاخِرَة وَلَكُم فيها ماتَشتَهي أنفُسَكم وَلكم فيها ما تَدعون نُزلاً مِن غفور رحيم﴾ فُصلت/٣٢.

واتە: ئەوانەی دەڵێن (الله)پەروەردگارمانەپاشان دامەزراو دەبن لەسەر ئیمانەکەیان لەکاتی سەرەمەرگدا فریشتە دادەبەزنە سەریان پێیان دەڵێن: مەترسن لەچارەنوستان و خەم مەخۆن بۆ ئەوانەی جێی دەهێڵن و مژدەتان لێ بێت بەو

بەهەشــتەی بــەڵێنتان پێــدراوە. ئێمــە دۆســت و هاوەڵتــانین لــە ژیــانی دونیــاو دواڕۆژدا.وە ئــەو بەهەشتە چی نەفستان ئارەزووی بکات تیایدایەو چی داوا بکەن دەتاندرێتی.ئەمەش میوانداریەکی گەورەیە لەلایەن خوای لێ بووردە و مهرەبانەوە.

زەیــدی کــوڕی ئەســلەم دەفــەرمووێت : مەلائیکەتەکان لە کاتی سەرەمەرگ و لە گۆڕو لە کاتی زیندوبوونەوەدا مژدە دەدەن بە ئیمانداران.

# گرنگی دامەزراوی

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وألو استقاموا على الطريقـة لأسقيناهم ماءاً غدقاً لنفتنهم فيـه ومـن يعـرض عـن ذكـر ربـه يسلكه عذاباً صعداً﴾ الجن/١٦.

واتـە: ئەگـەر دامـەزراو بوونایـە لەسـەر ڕێگـای ڕاستی ئیسـلام ئـەوا بـارانی زۆرو بەسـوودمان دەڕژانـد بەسەریاندا تا تاقیان بکەینـەوە (کامیان دامـەزراوە). وە هەرکەسێك ڕوو وەرگێڕێت و پشت بکات لـەیادی خـوای گەورە ئەوا ئەیخاتە ناو سزای سەختەوە.

هیچ کەسێك بە ئەندازەو وێنەی پێغەمبەران لە گرنگی دامەزراوی تێ نەگەیشتووە .خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿فاستقم كما أمرت ومن تاب معك ......﴾ هود/١١٢

واتە: وەك چۆن فەرمانت پێ کراوە دامەزراو بـە خـۆت و ئەوانەش کە لەگەڵ تۆ دا تەوبەیان کردووە.

ئـیبن عـەبباس(ڕەزای خـوای گـەورەی لێ بێـت) دەفـەرموێت: هـیچ ئایـەتێك هینـدەی ﴿فاسـتقم كمـا أمرت...﴾ قورس نەبوو لەسەر پێغەمبەری خوا.

هــەر لەبــەر ئەمــەش بــوو کــاتیٚ پرســیاریان کــرد لــە پێغەمبەر ی خوا ﷺ کە بۆچی وا پیر بوویت؟ فەرمووی : (**شـــيّبتني هـــود وأخواتهـــا**). واتــە: ســورەتی هــود و هاوشێوەکانی پیریان کردم.

پێغەمبــەری خــوا ﷺ دەفــەرموێت:(خۆتان لــەخوای گــەورە نزیـك بکەنـەوەو کـارو کـرداری ڕاسـت و دروسـت ئەنجام بدەن . چاکیش بزانن کەستان بە کردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشتەوە. ووتیان تۆش ئەی پێغەمبەری خـوا؟ فـەرمووی : منـیش . مەگـەر خـوای گـەورە بـە بـەزەیی و فەزڵی خۆی دامپۆشێت).

جا لەبەر ئەم هەموو گرنگی یەی دامەزراوی بووە کاتیٚ سوفیانی کوڕی عبدالله (ڕەزای خوای لیٚ بێت) پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردو فەرمووی: (**قـل لـي في الاسـلام قولاً لا أسأل أحداً غيرك** ) واتە: شتێکی وام لە ئیسلامدا پیٚ بڵیٚ (ئەمەندە گشتگیرو تینوو شکێن بێت) ئیتر پرسیار لـە کەسـی تـر نەکـەم؟ ئـەویش فـەرمووی: (**قـل امنـت بـالله ثـم اسـتقم**) واتـە: بڵـیٚ بـاوەڕم بـە خـوای گـەورە هێنـاو پاشـان دامەزراو بە لەسەری./ رواه مسلم

هاوەڵــە بــەڕێزەکانی پێغەمبــەری خــواش ﷺ.
ئەوانــەی لەچــاکترینی ســەدەکاندا ژیــان. ئــەو ئەستێرانەی لە دەوری مانگی پڕ نووری نبووەت لە تیشکی زێڕینی ئەو ڕووناکیان وەردەگرت. زۆر جوان لەم مەبەستە تێ گەیشتبوون بۆیە گەشتنە ئەو ئاستەی خوای گەورە لێ یان ڕازی بێت و ناویان لە قورئاندا تۆمار ببێت. ئەوان جیاوازی یان لەگەڵ ئێمە (وەك سەیید قطب دەفەرمووێت) ئەوەبوو:

یەکەم: کاتێ دەهاتنە ئیسلامەوە نەدەگەڕانەوەو دامەزراو دەبوون وبەرگی پیس و چڵکنی نەفامێتییان بەیەکجاری فڕێ دەدا.

دووەم: ئەوان وەرگری کارپێکەر بوون . ووتارو دەقەکانیان بۆ جێبەجێ کردن دەبیست نەك بۆ کەڵەکەکردنی زانیاری بێ سوود.

سێیەم: ئەوان ئیسلامیان بەگشتگیر وەردەگرت و هەموو لایەنەکانیان دەست پێوە دەگرت و دەیانکردە

**كـــالأى بالأيـــان و هـــيچ بوارێكيـــان فـــەرامۆش نەدەكرد.** /بڕوانە كتێبی معالم في الطريق.

**ڕۆژێكيان پێغەمبەری خوا ﷺ دەگات بە حـاريسـەی كوڕی سوراقە (ڕەزای خوای لێ بێت) و دەفـەرمووێت : حاريســە ئــەم بــەيانی يــەت چــۆن كــردەوە ؟ ئــەويش فــەرمووی : بــە ڕاسـتی بــە ئيمانــداری ڕاســتەقينەيی بەيانيم كردەوە. فـەرمووی: بزانـە چـی دەڵێيت.چونكە هەموو شتێك ڕاستێتی هەيە (واتە جا ڕاستی وتەكەت چی‌يە؟)**

**حاريسە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پشتم لــە دونيــا كــردووە بــە جۆرێــك شــەوان بەخەبــەرم و شەونوێژ دەكـەم. بە ڕۆژيـش بە ڕۆژووم و تينـووم. وە دەڵێيــت بــە چــاوی خــۆم عەرشــی خــوای گــەورەم لێ ديارەو دەيبينم. وە وەك ئـەوە وايـە تەماشای خـەڵكی بەهەشــت بكــەم ســەردانی يــەك دەكــەن و تەماشــای خەڵكی دۆزەخ بكەم زريكەيان دێت تێيدا. پێغەمبـەری خوا ρ فەرمووی: (أبصـرت فـألزم عبـد). واتـە: ڕێگـات**

دۆزیوەتەوەو ئیمان لە دڵتدا ڕوواوە جا ئەی بەندەی خوا چەسپاوو بەردەوام بە . حاریسە فەرمووی: دە سا دوعای شەهیدیم بۆ بکە. پێغەمبەری خواش ﷺ بۆی پاڕایەوە./السيرة الحلبية ٢/٤٠٥.

جا حاریسە بە دامەزراوی و چەسپاوی لە خزمەت ئیسلامدا بوو تا لە جەنگی بەدردا بە تیرێکی وێڵ کە بەر گەردنی کەوت شەهید بوو. ڕوبەییعی کچی نەضری دایکی کاتێ هەواڵەکەی پێ گەییشت فەرمووی: سوێند بە خوا بۆی ناگریم تا پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەم.جا کاتێ پێی گەییشت فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵم نادەیتێ دەربارەی حاریسەی کوڕم.ئەگەر لە ئەهلی بەهەشتە ئارام دەگرم. وە ئەگەر غەیری ئەوەشە گریانێکی چاك بۆی دەگریم؟ ئەویش فەرمووی : **(یا أمّ حارثة انها جنان في الجنّة .وانّ ابنك أصاب الفردوس الأعلى )**.
رواه البخاري ٦/٢٦ و ٧/٣٠٤ و١١/٤١٥

واته: ئەی دایکی حاریسە بەهەشت یەك دانە نی یە بەڵکو چەندان باخچەو باخات و بەهەشتە لەناو بەهەشتدا . وە کوڕەکەی تۆش فیردەوسی ئەعلای بە نسیب بوو. دایکیشی بە پێکەنینەوە گەڕایەوەو دەیووت: بەخ بەخ بۆ تۆ ئە حاریسە.

## هۆکارەکانی گەیشتن بە دامەزراوی چی یە؟

١-**پاڕانەوە**: ئەمیش چاکترین هۆکارە کە لە خوای گەورە بپاڕێیتەوە دڵت دامەزراو بکات . ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: **(یا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك** ). رواه الترمذي وهو حديث حسن.

واتە : ئەی خوای وەرگێڕی دڵان دڵم دامەزراوو چەسپاو بکە لەسەر دینەکەت .

جا ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ پاڕابێتەوە بۆ دامەزراوی ئەبێ ئێمە چۆن نەپاڕێینەوە.

## ٢-هاوڕێ یەتی کردنی کەسانی خواناس و وورە بەرزو دامەزراو:

چونکە ئەو کاریگەری یەی هاوڕێ هەیەتی لەسەر هاوڕێ لای کەس شاراوە نی یە. جا نەك هەرگیز هاوڕێیەتی نا موسڵمان مەکە بەڵکو لەناو موسڵمانانیشدا بزانە کامیان بەوورەو هیممەت بەرزە ئەوەیان بکە بە هاودەمی کاتەکانت .

شێخ عبدالقادری گەیلانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: **(سیروا مع الهمم العالیة )**. واتە: لەگەڵ هیممەت بەرزاندا بڕۆن بە ڕێدا.

## ٣-دوور نەکەوتنەوە لە کۆمەڵی موسڵمانان:

وە تێکەڵاو بوونیان لە خێرو چاکەدا چونکە ئەو شەیطانە زۆر زان و گومڕاکەرەی زۆر کەسی دینداری لە خشتە بردوو لە ڕێ ی ڕاست خلیسکاندی لەکۆمەڵ نزیك نابێتەوەو دەرەقەتیان نایەت. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **(انما یأکل الذئب من الغنم القاصیّة)** .

واتە: گورگ مەڕی لە مێگەل دابڕاو دەخوات. وەدەفەرموێت: **(ان الشیطان مع الواحد وهو من الأثنین**

**أبعــــد**). واتــه: بــێ گومــان شــەیطـــان لەگــەڵ یەکــەو لە دوو دووره.

## ٤-موحاسەبەی خۆ کردن و لێ پێچینەوەی نەفس:

**به تایبەتی له شەواندا پێش نوستن .خوای گەوره دەفەرموێت:** ﴿ یا أیّها الذین امنوا اتقوا اللّٰه ولتنظر نفس ما قدّمت لغد .....﴾ الحشر.

**واته: ئەی ئیمانداران تەقوای خوا ابکەن و هەرکامتان بزانن چیتان پێش خستووه بۆ دواڕۆژو قیامەت .**

**عومەری کوڕی خەتتابیش (ڕەزای خوای لێ بێت) دەیفەرموو: (حاسبوا أنفسكم قبل أن تحاسبوا. وزنوا انفسكم قبل أن توزنوا. وتزيّنوا للعرض الأكبر).** تأريخ عمر - ابن الجوزي -٢٠١.

**واته : له نەفسی خۆتان بپرسنەوه پێش ئەوەی له قیامەتدا لێتان بپرسرێتەوه. وه کردەوەکانتان بکێشن پێش ئەوەی له قیامەتدا بکێشرێت.وه خۆتان به کردەوەی جوان بڕازێننەوه بۆ نمایش کردنه گەورەکەی قیامەت.**

جـا موحاسـەبەی خـۆکردن گـەورەترین هۆکـارو فاکتـەری ساغ بوونـەوەو بـەردەوام بوونـە بـە تایبـەتی ئەگـەر دوای ( مـەرج لەگـەڵ خـۆداگرتن و –چـاودێری خـۆکردن و– سـەرکۆنە کـردن) بێت./بڕوانـە کتێبـی ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون .

عامری کوری عبداللە دەفەرموێت: چەندان کەسم لە هاوەڵانی پێغەمبەر ρ بینیوەو هاوەڵایەتیم کردوون. جا بۆیان باس کردووم کە چاکترین ئیماندار لە ڕۆژی دوایی دا ئـەو ئیماندارەیـە کـە زۆر موحاسـەبەی خـۆی دەکات./الزهد لأحمد ص٢٢٦.

# له کۆتایی دا

براو خوشکی بەڕێزم ئێستا زانیت دامەزراوی چەندێك گرنگ و پێویستە . وە زانیت هیچ ئەمینی یەك نی یە کە -خوا بمانپارێزێت- شەیطان لە ساتێك لە ساتەکانی تەمەندا بتدات بە زەوی دا و ڕەنجەڕۆ و خەسارەتمەندت بکات و سەرجەم ئەو عیبادەت و کردەوە چاکانەی مانگی ڕەمەزان و مانگەکانی تری تەمەنت هەڵوەشێنێتەوە. لەبەرئەوە دەخیل و سەد دەخیل ئاگات لەو دەستمایەو گەوهەرە بە نرخە بێت (کە ئیمانەکەتە) . وە شەیطانەکانی ئینس و جین لە بۆسەدان تا لێی بفڕێنن .چاکیش بزانە خوای گەورە بە موسڵمان بوون یان نە بوونی من و تۆ و بگرە سەراپای بونەوەریش هیچ لە موڵك ودەسەڵاتی زیادو کەم ناکات . وە ئەوە ئێمەین موحتاجی ئەوین. ئەم

کاروانه خوایی یەش چەندی لێ دەکەوێت ئەوەندەی تری دەچێتەوە ناو وە بە واز هێنانی کەس زیانی لێ ناکـەوێت. وەك حەسـەن بـەننا (بەڕەحمـەت بێـت) دەفـــەرموێت: (ڕابـــوونی ئیســـلامی بەوینـــەی شەمەندەفەر وایە. هەیە تا یەکێك لە وێسگەکان سەر دەکەوێت . هەشە تا دووا مەنزڵ دانابەزێت و کۆڵنـادات . جـا چـەندیش دادەبـەزن هێنـدەش سەردەکەون).

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە تا دووا ویستگەی ژیانمان کۆڵنەدەرو دامەزراو بین و خوای گەورە بمانپارێزێت لە تۆڕی جاڵجاڵۆکەو شەیطان و دەجالە گومڕاکەرەکانی سەردەم.